(بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)

وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْماً

بیر و باوەڕی محمد بن عبدالوهاب



# پێشەکی

**(بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ)**

**{إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهْ وَنَسْتَهْدِيْهِ وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ. أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ. اَللَّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَمَنِ اهْتَدَى بِهُدَاهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ}**.

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهان و ئاسمان و زەوی و دروستکەری هەموو بوونەوەر،وە داوای یارمەتی و لێبوردن هەر لەو دەکەین ، وە پەنای پێدەگرین لە شەیتان و شەیتان پەرستان وە لە هەموو خراپیەکی دونیا ، بێگومان ئەوەی کە خودا هیدایەت داوە تووشی تاریکای نایەت وە ئەوەشی کە خودا تووشی تاریکایی کردووە هەرگیز ڕێگای حەق و راستی نادۆزیتەوە.

ئەم نامیلکەیە باسی بیر و باوەری شێخی ئسلام {**محمد بن عبد الوهاب }** دەکات  لە باسکردنی زانستی تەوحید و ناسینی ئیسلام دەکات لەسەر بنەمای قورئان وسونەت و زانایانی سەلەف.



# ئیسلام چیه ؟

قال شێخ الاسلام { محمد بن عبد الوهاب }

ألإسلام هي الاستسلام لله بالتوحيد، والانقياد له بالطاعة، والبراة من شرك واهله.

- **الاستسلام لله بالتوحيد**: واتا خۆت دابرێنیت لەهەموو شەریکێک و هاوەڵێک و هەرچی هۆکاری نواقضێکی ألإسلام هەیە خۆ لێی بە دوور بگریت

- **الانقياد له بالطاعة**: واتا خۆت ملكەچی الله بکەین گوێڕایەڵیٚ بکەین وە تەنها بەس بە ئیمان نابێت، تەنها تەوحید بەس نیه بەڵکو پێویستە بە کردەوە و عمل بکەین کەسێک عەمەلی نەبێت ئیسلام نیه .

- **والبراة من شرك واهله** واتا دەبێت دوژمنایەتی ئەوانە بکەین و خۆیان لیٚ بەدووربگرین لە خۆیان و ئەهلەکەیان بکەین لە پێناو الله تعالی ، ئەگەر البراءة نەبێت ئەوە ئەهلی شەو و نوێژ بیت و لە سوجدە بمریت ئەوا ئیسلام نیت.

به واتای ئەویە ئەگەر تۆ تەوحید هەبێت و ملکەچی بکەیت بەڵام براءة نەبێت ئەوە ئەگەر ئەهلی شەونوێژیش بیت هەر بە موشرکی دەمریت هیچت لێ وەرناگیرێت و قبوڵ نایێت ، هیچ یەکێک لەمانە بەبێ یەکتر قبوڵ نابێت و لێت وەرناگیرێت



❖ محمد بن عبد الوهاب :

مانای ئیسلامی دابەشکردووی بۆ سەر سێ بنەمای سەرەکی و گرنگ:- **{ العيلم،العمل،الدعوة،الصبر}**

❖ **العيلم {زانست} :** زانستت هەبێت دەربارەی دینەکەت و وە ناسینی الله تعالى ، وە پێغمبەرەکەی ، و دینی ئیسلام.

بەڵگە لەسەر ئەم : {**فَاعْلَمْ أَنَّهُ لا إِلَهَ إلا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ }** {محمد ١٩}

واتا: بزانە الله پەروەردگاری تاک و تەنهایە وە هەر ئەو لێ خۆشبووە لە گوناە و تاوانەکانتان.

الامامی البخاری دەلێت { باب العيلم قبل قول و العمل }

واتا: زانست پێش وتە و کردەوەیە

لێرەدا دەردەکەوێت کە خودای گەورە زانستی پێس وتە و کردەوە خستووە بە بەڵگەی قورئان

❖ **دووەم {العمل} کردار:** واتا کردەوەکردن بەم دینە.

عن ابي هريرة رضي الله عنه

قال رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم{ أشدُّ الناسِ عذابًا يومَ القيامةِ عالِمٌ لمَيَنفَعْه عِلمُه.

لە ئەبو هریرەوە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوەﷺ توندترین سزا لە ڕۆژی دواییدا بۆ ئەو زانایە کە دینەکەی الله بە عیلمەکەی بەرز نەکردۆتەوە

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت:

لە ڕۆژی دواییدا سێ تاخمێ پێش کافرەکان ئاگریان پێ خۆش دەکرێت، یەکێک لەوانە ئەو کەسەی ئەهلی عیلمە و بەڵام عمەلیبە عیلەمەکەی نەکردووە تەنها بۆ ریا کردوویەتی.

قال الشاعر

{من لا يعمل بعلمه، معذبن قبل عُبَّاد الوثن }

زانایەک کار بە زانستەکەی نەکات ئەوا سزا دراوە پێش بەندەی (الوثن)



الوثن : واتا  بتپەرستەکان

❖ **سێیەم {الدعوة} دەعوەکردن :** بەرزترین پایەی زانست دەعوە کردن بۆ ئەم تەوحید وەک پێغمەبەرمانﷺ و هاوەڵەکانی کە کردوویانە لە پێناو ئەم دینە.

بەمانای ئەوە تۆ عیلمەکەت هەیە وە عمەلیت پێی کردووە بەڵام دەعوەی بۆ ناکەیت ئەوا وەک دارێکیبیێ بەرەو وە تۆش نەتەوێ لە بەروبوومی دارەکە بخۆیت.

❖ **چوارەم{الصبر}سەبرگرتن:** سەبرگرتن و ناڕەحەتی لە فێربوونی عیلم هەموو کەس خێری عیلم نابێت ئەگەر سەبر نەگرێت گەورەترین نارەحەتیش،لە دەعوایە .

هیچ یەکێک لە پێغەمبەران بە بێ نارەحەتی و بەبێ ئازر ئەم دینەیان نەگایەندووە هەموویان توشی ئازار و نارەحەتی بوون و پێغەمبەری وا هەبووە لەت لەت کراوە ، پێغەمبەری وا هەبووە خراوەتە ناو ئاگر . بۆیە کە تۆ ئامادەی بۆ ئەم دینە دەحوا بکەیت دەبێت سەبریش بگریت لە سەر نارەحەتیەکانی.





بەڵگە لەسەر ئەم چوار بنەمایە

قال تعالى :

**بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ**

**{وَالْعَصْر (1) إِنَّ الْإِنْسَانَ لَفِي خُسْرٍ (2) إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ(3) }**

**{وَالْعَصْرِ}**

واتا: سوێند بە کات

خودای گەورە سوێندی بە کات و بە جۆرەها شتی خواردووە بۆ ئەوەی تێبفکرن و لێی تێبگەین، نەک بۆ ئەوەی مادام خودا سوێندی پێخواردووە تۆش سوێندی ،بخۆیت وە ناتوانیت خودای باڵا چی کرد و چ کارێکی کرد تۆش بیکەیت . چونکە سوێند خواردن بە غەیری الله و ناو سیفەتەکانی خۆی ئەوە شەریکە

پێغەمبەری‌خوا ﷺفەرموویەتی:

("مَن حَلِف بغير الله فقد كَفَر)

واتا: هەرکەسێک سوێند بە خودای گەورە بخوات ئەوە کوفری کردووە

تێبینیی :لە هەندێ فەرموودە هاتووە تەنها کوفر کردن نیە بەڵکو شەریکیشە



**{إِنَّ الْإِنْسَانَ لَفِي خُسْرٍ}**

واتا :الانسان لەخەسەرەتمەندی دایە و تیاچوونە

مەبەست لە دۆرانی لاشە و جەستە نیە چونکە پێغەمبەران ئەم دونیان جێهێشتووە، بەڵکو مەبەستی لە دۆرانی قیامەتە و لەدەستدانی قیامەت چونکە لە فەرموودەش باس لی کراوە بۆیە پێغەمبەران وازیان لە دونیا هێناووە بۆ ئاخیرەت هەر وەک لە فەرموودەی صحیح هاتووە جار وابووە بەنی ئیسرایل ٣٠٠ پێغەمبەرایان کووشتووە لە یەک ڕۆژدا بۆیە لیرە مەبەستی لە دۆرانی ئاخیرەتە.

**{إِلَّا الَّذِينَآمَنُوا وَ عَمِلُوا الصَّالِحَاتِ}**

واتا تەنها ئەوانە نەبێت کە ئیمانیان هێناوە و کار وکردەوەی چاک دەکەن بەردەوامن لەسەر رازیکردنی الله تعالی

ئیمانی کەسێک کە بە دڵ و زمان و بەبێ عەمەل بێت ئەوا ئیماندار نیە،

بە پێچەوانەی جەهمیەکان ومورجئیەکان دەڵێن ئیمان تەنها ئیمانی دڵ و شهادە هەبێ بەسە ئەگەر نوێژیش نەکات ئەوا ئیمانداریت



**{وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ}**

واتا دەعوا بکەن بۆ حەق

بەو مانای دەعوا کردن بۆ خۆت و بۆ دەوروبەری خۆشت بکە چونکە ئەگەر بەتەنها بۆ خۆت بێت ئەوە دینەکەینەکەت هەر لە جێ خۆیەتی.

بە پێچەوانەی ناجیەکان کە عیلم تەنها بۆ خۆیان و لە سوودی خۆیان دەبێت و ناگەیێنن بە دەرووبەر و عەشیرەت و هۆزەکانیان

الله تعالی دەفەرموویەتی: **{وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ}** { الشعراء ٢١٤}

واتا؛ خزم و هۆز و قەومەکشیت ئاگادار بکەرەوە

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت بە عەلی خوای گەورە لیّ رازی بیت . دەڵێت ئەگەر یەک کەس لەسەر دەستی تۆ ئیمان بهێنێت ئەوا لە وشتری سوور گرنگتر و نرخی زیاترە.

وشتری سوور : لەسەردەمی ئەوان بە نرخترین شت بووە

هەتا لەحەدیسیکیتری صحیح هاتووە ئەگەر کەسێک لەسەر دەستی موشریکیک ببێت بە موسلمان و ئەهلی تەوحید ئەوا دەچیتە بەهەشت.



**{وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ}**

واتا: سەبرگرتن لەسەر دەعوا و لەسەر ئەو ئیمانە

بەبێ سەبرگرتن هەموو ئیمانت نامێنێت و بەرەو نەمان دەروا و لە دەستی دەدەین، ئەگەر سەبرمان نەبێت لە سزای کافرەکان کەئەهلی ئیمانی پێ سزا دەدەن ئەوا ناتوانیت بیگەێنیت ، کە سەبر هەبوو ئەوا گەورەترین سزات بدەن تۆ کۆڵنادەیت چونکە لە دڵت ڕوواندووە.



وە هەروەها خودایگەورە لەقورئانی پیرۆزدا

باسی**{اصحاب الخدود }** دەکات کە لەگەڵ پادشایەکەیان لە پێناو تەوحیدەکیەن سووتان و ئاگریان هەلبژارد

**﴿ قُتِلَ أَصْحَابُ الْأُخْدُودِ *النَّارِ ذَاتِ الْوَقُودِ *إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ *وَهُمْ عَلَى مَا يَفْعَلُونَ بِالْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ *وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلَّا أَن يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ ﴾** {البروج ٤-٨}

واتا: بە کوشتن چن، نەفرەتیان لیٚ بێت ئەوانەی کە چاڵیان هەڵکەند بۆ {ئیمانداران}،ئاگری داگیرساو و بەتینیان تێداکردووە،وە ئەوکاتەشی کە بە دەوریدا دانیشتبوون، لە نزیکەوە چاودێری ئەو کارەساتەیان دەکرد کە بەسەر باەڕداراندا دەهێنریت و خۆیان لە نزیکەوە سەرپەرشتیاندەکرد ،

تێبینی: **اصحاب الاخدود** ئەو هاوەڵە بەرێزانە بوون کە لە قورئانی پیرۆزدا باسیان هاتووە کە لە پێناو دینەکەی خۆیان لە دژی پادشا زاڵمەکەیان وەستان و دینەکەی الله تعالی یان هەڵبژارد ، ئاگر و سووتانیان لەگەڵ تەوحیدیان هەڵبژارد بەسەر جەهل وبیٚ دینی و شەریک

بۆیە سەبر گرتن لەسەر یەم دینە جیهادی دەوێت هەر وەک **ئیبن القیم** دەفەرمووێت :جیهادی نەفس چوار جۆرە :-

**جیهادی نەفس ،جیهادی شەیتان، جیهادی کافر ، جیهادی دووروو**

- جیهاد نەفس: واتا جیهادی نەفست بکەی بۆ ئەوەی فێری عیلمی بکەیت، فیری تەوحید وئیمانی بکەیت.

- هەر لە جیهادی نەفس ئیبن قیم دەڵێت دووم جۆری جیهادی نەفس ئەوەیە عەمەلی پیێ بکریت کردوەی پیێ بکەیت

- جیهادی نەفسی خۆت بکەیت بۆ ئەوەی دەعوا بکەیت ،خەلکی نزیکی خۆت و دەوروبەری فیر بکەیت وەک رسول اللهﷺ هەتا کۆتای ژیانی هەوڵیدا لەگەڵ مامی و کەسە نزیکەکانی بۆ دەعوەی تەوحید



